# مَنْهَجُ الإِمَامِ أَبِي حَاتِمٍ مُحَمَّدِ بْنِ حِبَّانَ البُسْتِيِّ فِي بَعْضِ كُتُبِهِ

**به كوردی**

إملاء

فضيلة الشيخ

## سليمان بن ناصر العلوان

وەرگێڕان و تەعليق

**هاوكار كوردی**

# مَنْهَجُ الإِمَامِ أَبِي حَاتِمٍ مُحَمَّدِ بْنِ حِبَّانَ البُسْتِيِّ فِي بَعْضِ كُتُبِهِ

به كوردی

إملاء

فضيلة الشيخ

## سليمان بن ناصر العلوان

وەرگێڕان و تەعلیق

هاوکار کوردی

**بەناوی الله تعالی**

**سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ الله تعالی وە درووود و سڵاو بۆ گیانی کۆتا پێغەمبەر محمد صلی الله علیه وسلم کە هیچ پێغەمبەرێك دوای ئەو نەهاتووە لە پاشان :**

**وا بڵاو بووە لای زۆرێك لە زانایانی ئەم سەردەمەی ئێمە کە پێشەوا ( ابن حبان 354 ت ) خەم سارد و ئاسان ڕۆیە لە ( تصحیح )ی فەرموودەدا , ئەو ڕاویانە تەوسیق و تەعدیل دەکات بە چاکە کە زۆرێك لە زانایانی ئەهلی فەرموودە بە لاوازیان داناوە و ( تەجریح )بریندداریان کردووە لەبەر هەر هۆکارێك لە هۆکارەکانی لاوازی , وە ئەم فەرموودانەی بە ( صحیح ) داناوە کە لێکۆڵەرانی فەرموودە بە لاوازی دادەنێن , تاوەکو گەیشتە ئەم ڕادەیەی کە پشت بە وتە و بیروباوڕی لە ( تصحیح و تضعیف ) فەرموودەدا نەبەسترێت و ئیهمال بکرێت , ئەوەش بەڕاستی زۆر دوورە لە صەواب وە دوورە لە لێکۆڵینەوە و وردەکاری لە دەق و زاراوەکانی زانایان , هەربۆیە بە کورتی باسی سێ پەرتووکی دەکەم :**

1 – الصحيح

2 – المجروحين

3 – الثقات

**وەك ئینساف بۆ ئەم ئیمام و پێشەوایە بەڕێزە , وە بۆ ڕوون کردنەوەیەك بۆ قوتابیانی زانستی شەرعی لەم سەردەمەی خۆمان کە بڵاوە بە وتە و شتانێك دەدەن بەبێ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ وتەی زانایانی ( متقدمین ) کە زۆرتر پشت دەبەستن بە زەهەبی و ئیبنو حەجەر کە لە ( متأخرین )ن , لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ زۆرێك لە وتەی ( المعاصرین ) دەڕۆن و لەسەری ناوەستن.**

## کتێبی ( الصحیح ) [1]

**خوێندنەوەی کتێبی ( الصحیح ) ئەوەی بۆ بە دەست هێناین کە دەتوانین دابەشی بکەین بۆ سێ بەش :**

**یەکەم : کتێبی ( الصحیح ) جومهوری ئەهلی علم کۆکن لەسەر زۆرینەی سەحیحی فەرموودەکانی و قەبول کردنی وەك کتێبێکی سوونەت , ئەوەش سوپاس و منەت بۆ الله تعالی بەشێکی زۆری کتێبەکەی گرتۆتەوە , ئەو ڕاستیە دەزانن ئەگەر بێت و بە وردی کتێبەکەی بخوێنیتەوە و سەیری بکەیت .**

**دووهەم : ناکۆکی و جیاوازی زانایانی لەسەرە لەوەی کە پێشەوا ابن حبان هەندێك لە ڕاوی فەرموودەکانی لە ( الصحیح ) هێناوە کە جێگای ناکۆکی و تەجریح و بریندارکردنی زانایانن ئەوەش نابێتە عەیب بۆ ئیمام لەبەر ئەوەی ئەویش ئیمامێکە لە ساحەکە هیچ نامۆ نیە کە ( تعدیل و تجریح ) بکرێت چونکە خاوەن پێگەیەکی زانستیە ئەو پیاوانەی کە جێگای ناکۆکین ئەوانەن : موحەمەدی کوڕی ئیسحاق و موحەمەدی کوڕی عجلان و عەلای کوڕی عبدالرحمن و مەتلەبی کوڕی حەنتەب وە جگە لەوانیش , بەڵام ئەم پیاوانە فەرموودەکانیان لە دەرەجەی ( حسن ) نایەنە خوارەوە , مع العلم ئیمامی موسلم لە صەحیحەکەید (موحەمەدی کوڕی ئیسحاق و موحەمەدی کوڕی عجلان ) هێناوەتەوە [2]**

---

(1). تعلیق : ژمارەی فەرموودەکانی ( 7491 ) فەرموودەیە ئیبن حبان شێوەی سەحیحەکی لەسەر ( التقاسیم ) داناوە وەك : دەست پێکی بە پەرتووکی ( الوحی ) دەست پێدەکات و کۆتایی بە پەرتووکی ( مناقب الصحابە ) دەهێنێت , ئیمام خاوەن مەنهج و مەرجی خۆیەتی لە قەبوڵ کردن و ڕەت کردنەوەی فەرموودە ئەمەش مەرجەکانی : **یەکەم** : عەدالەتی ڕاوی لە دین بە داپۆشیکارێکی جوان . **دووهەم** : ڕاستگۆیی و بەناوبانگ بوون تێیدا . **سێ یەم** : خاوەن عەقڵ و ژیری بێت لەوکاتەی کە فەرموودە دەگێڕتەوە . **چوارەم** : زانست و فیقهی هەبێت بە واتای فەرموودەکان لەوەی لە واتاکەی دەرنەچێت کاتێ بیەوێت بە مانا بیگێڕتەوە ( الروایە بالمعنی ) **پێنجەم** : لە هیچ فەرموودەیەك تەدلیسی نەکردبێت , ئەم مەرجانەی کە باسی کرد لە دوو هەزار شێخی تەنها سەد و پەنجا شێخی تێیدا کۆبۆتەوە .

(2) ئیمامی حاکم دەفەرمووێت : ئیمامی موسلم **سێزدە** فەرموودەی بە شواهد لە موحەمەدی کوڕی عجلان گێڕاوەتەوە و هێناویەتی لە صەحیحەکەیدا , وە **پێنج** فەرمووەی موحەمەدی کوڕی ئیسحاقی هێناوە بە شواهد لە صەحیحەکەیدا ) میزان الاعتدال

**سێ یەم : ئیمامی ابن حبان ڕەحمەتی الله بێت بەسەریدا تووشی ( وهم ) غەلەت بووە لە فەرموودە تێیدا وەك گێڕانەوەی فەرموودەی : سەعیدی کوڕی سەماکی کوڕی حەرب [3] کە لەباوکی ڕیوایەتی کردووە ئەویش لە جابری کوڕی سەمرە کە (أن النبي صلى الله عليه وسلم كان يقرأ ليلة الجمعة في صلاة المغرب بقل يا أيها الكافرون وقل هو الله أحد) ئەم فەرموودەیە ( مەتروکە ) ئیبنو حاتم بە سەعیدی کوڕی سەماك دەفەرموویێت ( متروك الحديث ) بەڵام ئەوە نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ابن حبان ( متساهل ) لەبەرئەوەی مرۆڤە هەڵە دەکات و دەشی پێکێت , عیبرەت و ئامۆژگار بە زۆری پێکانە ( صواب ) ئەوەشی زۆرە الحمداللە وەك پێشتر باسمان کرد وەك شاعر دەڵێت :**

................. كفى بالمرء نبلا ان تعد معايبه **: بەسە بۆ خاوەن ژیریەك کە عیبەکانی بژمێردرێت . واتە : لەبەر زۆری صواب هەڵەکانی بە پەنجەی دەست دەبژێردرێت .**

**گەر سەیری ئیمامی بوخاری و موسلم بکەیت ڕەخنەیان لێ گیراوە لەسەر ( توثيق ) کردنی هەندێك لە ( الضعفاء ) یەکێك لەوانە ( إسماعيل بن أبى أويس ) [4] کە ئیمامی بوخاری لە فەرموودەی ( الأصول ) هێناویەتی کەچی لەسەر وتەی صەحیح ( ضعيف الحديث ) ئەوەی دەیەوێت تەواو تێبگات و قوڵ بێتەوە با بچێتە خزمەت کتێبەکانی تراجم الرجال وەك ( تهذيب الكمال و تهذيب التهذيب و الجرح والتعديل لان أبي حاتم ) نەوەك پشت ببەستیت لەسەر مختصرات .**

---

(3) تعليق : **جگە لە سەعیدی کوڕی سەماك ئەو پیاونەی ناو کتێبەکەشی زانایان فەرموودەکان و خۆیانیان بە ( متروك ) و ( معلول ) و ( منكر ) وەك : داود بن ابى هند و محمد بن إسحاق بن يسار و حماد بن سلمه و أبى بكر بن عياش.**

(4) **وە نمونەش : موصعەبی کوڕی شەیبە کە ئیمامی موسلم لە سەحیحەکەیدا فەرموودەی** ( عشر من الفطرة ) **گێڕاوەتەوە کە لەسەر وتەی صەحیح (** ضعيف الحديث **) وەك : پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وای بۆ چووە , سەیری ( شرح مسلم بکە 3/147 )**

## پەرتووكی ( المجروحين ) [5]

ئەمە پەرتووكێكی گەورەیە لەم بابەدا تاكە , تاوەكو ئەوەی كۆمەڵێك لە زانایان دەفەرموون ( هەر پیاوێك ابن حبان بە سیقەی دانا ئەوە بە ددانەكانتەوە بیگرە , وە هە پیاوێك زەعیفی كرد بوەستە لەسەری ) ئەوەش گرینگی و بەهێزی ( توثیق ) ابن حبان بەدیار دەخات .

وە هەردوو ئیمام : حافز زەهەبی و حافز ئیبن حەجەر ئاماژەیان بەوە كردووە كە ( ابن حبان متشدد فی نقد الرجال )

وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی دەبینین قسەی كردووە بە تەجریح لەسەر ( عارم محمد بن الفضل السدوسي ) لەگەڵ ئەوەدا ( إمام ثقة ) وە هەر حەوت خاوەن سوونەن ڕیوایەتیان لێ كردووە .

وە ابن حبان دەربارەی ( كثير بن عبدالله بن عمر بن عوف المزني ) دەفەرمووێت ( منكر الحديث ) ڕیوایەتی كردووە لە باوكی ئەویش لە باپیری كۆپی درووستكراو درووست نیە باس بكرێت لە پەرتووك وە نە لە ڕیوایەت ئیلا وەك شتێكی عجائیب باس بكرێت , لەگەڵ ئەوەشدا ئیمامی تورموزی فەرموودەی ( الصلح جائز بين المسلمين ) ی ( تصحیح ) كردووە هەروەها ئیمامی تورموزیش ( متساهل ) لای زانایانی ئەم سەردەمەی خۆمان .

---

(5) تعليق : ئەم كتێبە سێ ناوی هەیە ( المجروحين ...الضعفاء ... أسماء الضعفاء ) بە كورتی مەنهەجی ئیمام لەم كتێبە چیە ؟ دەتوانین مەنهەجی لەم چەند خاڵە كۆ بكەینەوە **یەكەم** : پێشەكی ئیمام بە درێژی باسی علم الرجال دەكات . **دووهەم** : ناوی ئەم ڕاویانەی لەسەر ( حروف المعجم ) داناوە . **سێ یەم** : ناو و نەسەب و نیسبەت و كونیەی باس كردووە لەمە زیاتر درێژی نەكردۆتەوە . **چوارەم** : هەندێك لە ڕاویەكان تەنهاساڵی لە دایك بوون و وەفاتی نووسیوە . **پێنجەم** : دەستەواژەی جەرحی لەسەر ڕاویەكان بەكار هێناوە وە زۆرینەی كات نەقلی وتەی زانایانی جەرح و تەعدیلی كردووە وەك : ئیمامی ئەحمەد و یەحیی كوڕی معین و یەحیی كوڕی سعید و ئیبنو مەدینی و فلاس و ...الخ **شەشەم** : ابن حبان یەكێكە لە زانایانەی تووند ڕاوی بریندار دەكات ( المتشددين فی الرجال ) بۆیە عیباراتی تووند دەبینیت لە كتێبەكەیدا . **حەوتەم** : لە كۆتایی فەرموودەی ڕاویە منكر هێناوەتەوە . **هەشتەم** : كۆمەڵێ قواعد و یاسای گرینگ و بەسوودی داناوە گەر سەیری كۆتایی كتێبەكەی بكەیت **نۆیەم** : جۆرەكانی جەرحی كردۆتە دە بەش لەیەكەم بەشی داناوە .

## پەرتووكی ( الثقات ) (6)

**لە بەدواداچوون بۆ ئەم كتێبە ئەوەمان بۆ بەدەست دێت كە دەتوانین دابەشی سەر چەند بەشێكی بكەین :**

**یەكەم : چەند كەسێك ( توثیق ) دەكات كە لە كتێبی ( المجروحین ) بە لاوازی داناوە ئەوەش لەبەر دوو حاڵەت :**

**ا – لەوەی كە ئیجتیهادەكەی گۆڕاوە لەسەر ئەم ڕاویە وەك گومان باش بوون لەسەری لە زانایانی ئیسلام .**

**ب - هەڵەی لێكردووە كە دیارە مرۆڤیش خاڵی نیە لە هەڵە .**

**لەسەر هەندێك كتێب وەستاوم ئەوانەی كە هەندێك لە ( تصحیح ) و ( تضعیف ) دەكەن لەم سەردەمەی خۆمان وە حوكم لەسەر فەرموودەكان دەدەن كە ابن حبان پەیوەست دەكەن بەوەی كە ( تصحیح ) وەرناگیرێت كەچی لە پەرتووكەكەی زیاد لە پەنجا هەڵەم لێ بینیوە , ئەگەر باس ئەوە بێت هەموو زانایەك دەبێت وتەكانیان پێشان بدرێت ئەوە ابن حبان لە پێش ترە .**

(6) تعلیق : ئەم كتێبەی ابن حبان یەكێكە لە باشترین و گەورەترین سەرچاوە لە زانستی ( الجرح والتعدیل ) بۆ گەڕانەوە بۆ حاڵی ڕاویە متمانەدارەكان بە كورتی باسی ئەم كتێبە : ئیمامی ئیبنو حبان ژمارەیەكی زۆری ڕاوی لەم كتێبە كۆكردۆتەوە كە زیاد لە ( 4475 ) ڕاوی لە : صەحابە و تابعین و تابع تابعین و وە ئەوانەشی لە تابعیەكان ڕیوایەتیان كردووە , سەرتا ناوی ڕاویەكە باس دەكات دواتر مامۆستا و قوتابیەكانی باس دەكات , لە سەرەتای پەرتووكەكە زیاد لە 245 لاپەڕە باس لە ڕووداوەكانی سیرەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم باس دەكات دواتر لە پاش ئەم 245 لاپەڕەیە باسی تەواوی خەلیفەكان دەكات هەر لە ئیمامی ئەبوبكر تاوەكو المطیع كوڕی المقتدر كۆتایەكانی خەلیفەی عەباسیەكان باس دەكات .

**دووهەم** : ئیمامی ابن حبان هەندێك ڕاوی ( توثیق ) دەكات كەچی جگە لەو لە زانایانی فحول بە لاوازی دادەنێن ئەوەش ڕێچكە و ڕێگای ئیجتیهادە , سەیركە ئیمامی ئەحمەد هەندێك ڕاوی ( توثیق ) دەات كەچی پێشەوا بوخاری ( تضعیف ) دەكات ئایە كەسی عاقڵ و ژیر دەڵێت : ئیمامی ئەحمەد ( متساهل ) ؟

وە هەروەها ئیبنو مەعین و ئیبنو مەدینی هەندێك لە ڕاویەكان ( توثیق ) دەكەن كەچی غەیری ئەوان هەمان ڕاویەكان (تضعیف) دەكەن هیچ كەسێك هاتووە بەوان بڵێ (متساهل) بوونە ؟

ئەگەر بێیت ئەم دەرگایە بكەیتەوە و زانایانی نوقاد بە ( تساهل ) لە قەلەم بدەیت لەگەڵ ئەم هەموو تێكۆشان و ماندووبوونەیان ئەوە دەرگایەكی گەورەت كردۆتەوە بۆ ڕوخاندنی ئیسلام و زانایانی ئیسلام .

**سێ یەم** : كە ڕیوایەت نەكات لە ڕاویەك ئیلا یەك ڕاوی نەبێت [7] وە هیچ ئینكاریكارێك نەهێتە پێش بۆ فەرموودەكەی لەبەر ئەوەی ابن حبان وا دەیبینێت كە ( ثقة )یە لەبەر ئەوەی موسڵمانان هەموویان عادلن لەم بابەتەدا ئەوە سیفەت و مەنهەجی ابن حبانە لە كتێبی( الثقات )ئەوەش ئیجتیهادی خۆیەتی جمهور پێچەوانەی ئەوی كردووە بەڵام وتەكەی تا ئەو ڕادەیە لاواز نیە بەڵكو لە وتەكەیدا بەهێزیەك هەیە بە تایبەت لە تابعین بەڵكو ئیبنو قەیم دەفەرموێت (ڕاوی نادیار (المجهول)ئەگەر بێت كەسێكی متمانەدار لێی ڕیوایەت بكات ئەوە تەعدیلی جێگیر دەبێت ئەگەر یەك دانەش بێت لەسەر بەهێزترن و ڕاسترین ئەم دوو وتەیە)[8]

---

(7) بە مەرجێك متمانەدار بێت , ئەگەر بێت و لاواز بێت ئەوە ابن حبان ( توثیق )ی ناكات وەك لە كتێبی ( المجروحین ) لە تەرجومەی سعید بن زیاد الداری وتەی هەیە لەم باسە .

(8) زاد المعاد 5/ 456

زۆرینەی ( المعاصرین ) تەنها لەو باسەدا عەیب کەوتۆتە سەریان کە هەرکاتێ باسی ابن حبان دەکەن لە کتێبەکانیان ئیلا بەوە وەسفی دەکەن کە ( متساهل ) بووە لە ( تصحیح )دا وە پشتی پێ نابەسترێت , بەڵام ئەگەر بێیت سەیری مەنهەجەکەی بکەیت ئەم ( تساهل ) بە قەید هەیە لە هەندێك لە باسەکان نەوەك بە گشتی ( متساهل ) بووە کە پێگەی پیاوێکی ئاوا سادە نیشان بدەیت تاوەکو ئەو ڕادەیەی کتێبەکانی ئیهمال بکرێت بەبێ هیچ لێکۆڵینەوەیەك هەندێك شتی بە چاك بزانیت و هەندێکی تری بە خراپ .

**چوارەم** : ئەوەیە کە ڕیوایەت بکرێت لە ڕاوی دوویان زیاتر وە هیچ کەسێکیش ئینکاری فەرموودەکەیان نەکات ئەوە ابن حبان لە کتێبەکەیدا هێناویەتەوە ئەوەش هیچ قسەیەك نایەتەوە سەری لەبەر ئەوەی ئەوە صەوابە .

مع العلم زانایان جیاوازیان تێکەوتووە لەم باسە لەچەند وتەیەك:

1 – القبول مطلقا ( ئەوە ڕاجحە )بە گشتی وەردەگیرێت

2 – الرد مطلقا بە گشتی ڕەت دەکرێتەوە

3 - التفصیل درێژەی دەوێت

صەواب : یەکەمە (القبول مطلقا) بە مەرجێك : هیچ شتێك نەیەت کە ئینکاری بکات .

لەبەر چەند ڕوویەك ڕاجحە :

**یەکەم** : ڕیوایەتی دوو کەس زیاتر جەهالەت ناهێڵێت لەسەر وتەی صەحیح ئیبنو قەیم وتەی لەسەر هەیە [9]

**دووهەم** : هیچ شتێك نەیەت ئینکاری فەرموودەکەی بکات ئەوە فەرموودەکەی لەم حاڵەتدا حوکم دەدرێت بەبێ بەڵگە .

---

(9) زاد المعاد 38/5 وە هەروەها ئیمامی دار قطني لە سونەنەکەیدا 174/3 لە ئەهلی علمەوە باسی کردووە .

سێ یەم : ئەم دوو ئیمامە ڕیزدارى : بوخارى و مسلم لە صەحیحەکەیاند فەرموودەى خاوەن ئەم سیفەتانەیان گێڕاوەتەوە [10] نمونە :

( جعفر بن أبي ثور ) ڕاویەکە کە لە جابرى کوڕى سمرە فەرموودەى ( الوضوء من أكل لحوم الإبل ) دەگێڕتەوە ئیمامى موسلم ئەم فەرموودەیە دەگێڕتەوە وە ئوممەت قەبوڵیان کردووە , تاوەکو ئەوەى ابن خوزەیمە دەفەرمووێت ( نەم زانیوە خیلاف هەبێت لاى زانایان لە قەبوڵکردنى ئەم فەرموودەیە ) لەگەڵ ئەوەشدا ( جعفر بن أبي ثور ) کەس ( توثيق )ى نەکردووە ئیلا ابن حبان نەبێت بەڵام هیچ شتێك نەهاتووە ئینکارى فەرموودەکەى بکات , ئەو کەسەى دوو ڕاوى زیاتر لێى بگێڕنەوە ئەوە زانایان فەرموودەیان وەرگرتووە , وە ئەوەى ڕیواەتى لێ کردووە : عثمان بن عبدالله بن موهب و أشعث بن أبي الشعثاء وسماك بن حرب

وە ( ابو سعيد مولى عبدالله بن عامر بن كريز ) ڕاویەکەکە لە ئەبى هوریرە فەرموودەى ( لا تحاسدوا ولا تناجشوا ولا تباغضوا ولا تدابروا ...) دەگێڕنەوە کە موسلم هێناویەتى .

ابو سعید ئیمامى موسلم لە صەحیحەکەیدا هێناویەتى مع العلم کەس ( توثيق ) نەکردووە ئیلا ابن حبان نەبێت بەڵام ابو سعید فەرموودەى ناگێڕتەوە ئیلا لە ( ثقات ) متمانەداران نەبێت وە هیچ کەسیش ئینکارى فەرموودەى ناکات .

زانایان فەرموودەیان قەبوڵ کردووە وە ئەوانەى لێى دەگێڕنەوە : داود بن قيس و العلاء بن عبدالرحمن و محمد بن عجلان وە جگە لەوانیش .

لە هەردوو صەحیحى بوخارى و موسلم لەم نمونانە زۆر دەدۆزیتەوە , تاوەکو ئەوەى حافزى زەهەبى لە تەرجومەى ( مالك بن الخير الزيادى ) دەفەرمووێت : ئیبنو قەتان دەفەرمووێت : عەدالەتى جێگیر نەبووە .

---

(10) وە هەروەها لەوە بە دڵنیایى ئەگەر ڕاویەك زیاد لە دوو کەس لێى گێڕاوە وە هیچ شتێك ئینکارى نەکات ئەوە فەرموودەکەى دەبێتە حوجە ( کۆ دەنگى ئەهلى حەدیس لەسەر ئەوەیە فەرموودەى حميده بن عبيد بن رفاعة کە لەباسى پشیلەکە - تصحيح - دەکرێت )عون المعبود 1/ 140 .

حافزی زەهەبی دەفەرموویت : مەبەستی ئیبنو قەتان ئەوە بووە هیچ دەقیێك نیە بلێیت ئەو متمانەدارە .

له هەردوو صەحیحەکەدا ژمارەیەکی زۆر ڕاویمان هەیە کە کەس دەقیێکی نیە لەسەر ( توثیق ) بوونیان , جمهور لەسەر ئەوەیە کە هەر شێخێك لە ڕاویەکان کۆمەڵێ کەس ڕیوایەتیان لێ کرد وە هیچ شتێك نەهات ئینکاریان بکات ئەوە فەرموودەکەی صەحیحە .

تەواو بوو

سوپاس بۆ الله تعالی وە درووود بۆ سەر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم

ئەوە کۆتا نوسینی شێخمانە

باوکی عبدالله سلیمان بن ناصر العلوان

بریدە

بەیانی ڕۆژی سێ شەم

14 / محرم / 1413 هجری

**تەواوبووم لە وەرگێڕان و تەعلیق لەسەر ئەم چەند لاپەڕەی شێخ**

**لە شەوی سێ شەم**

**زستانی ساڵی**

22 / 6 / 1441 **کۆچی بەرامبەر** 18 / 2 / 2020 **عیسایی**

**کوردستانی باشوور**

